((دار لەداری، کون لە داری، moo گیسکی هاوساری، مل دابڕاو وەرە دیاری؟))
(مەشکە؟؟)

((دار لە داری ،چەرم لە داری، ملە دابڕاو، تۆ بێ دیاری)) (مەشکە)

((تشتکی من ژتشتا، دەرێ وی ل دەرێ دایکا تە، گووێ وی د دەڤێ بابێ تە؟))
(مەشکە ژەندن و نویشك)

((گای ڕەش، گوی سپی دەکا))، ((مردی سلێ سپی؟)) (مەشکە و نویشك)

((مریشکێکم هەیە زەنگێ زەنگێ، هێلکە ئەکا پڕ بە چەنگێ ؟))
(مەشکە و کەرە، نویشك، کێمەشك، رۆنمەشك)

((ئەگرمێنێ وەکو هەور، فڕێ ئەدا سڵی چەور؟)) (مەشکە و نویشك)

((کەوڵی نێری شاخدارە، هەڵدەواسرێ بە دارە،خواردنەوەکەی سازگارە؟)) (مەشکە)

((مەلێکم هەیە بە حەواوە، پەتەکەی کراوە، مەلەکە رشاوە؟)) (مەشکە و نویشك)

((ئەم لای گڵ و ئەو لای گڵ، تێیدایە نەرمەکەی دل؟))؟ (ماستی ناو گیتەڵ-گۆزەی)

((هۆڤە ئاخ و وێڤە ئاخ، یێ دناڤ دا میر پەداخ؟)) (جەڕکێ روینی، دیزەی رۆن)

((ڕەشەکەی بنەبانێ، خۆش خۆش دەچێتە کابانێ ؟)) (هیزەی رۆن)

((ڕەشی لە بنەبانێ, هەڵدێتە کابانێ ؟)) (هیزە و ڕۆن)

((کەری ڕەش مەزرەقی خۆش؟)) (هیزە و ڕۆن)

((تانجی زەردوو لە کونا مردوو؟)) (هیزە و ڕۆن)

((یەکی رەشی بە موو، لە ئاوێ دەرچوو، سواری پشتی دایکت بوو؟)) (کووندە)

((لە ئاو دەردێ ، لە کەیبانو(باوکت) هەڵدێ؟)) (کووندە)

((نەبایە نەبارانە،لە بەینی دوو دارانە،چك چکەی دلۆپانە))(کووندە و کوندەلأن)

((ئەملای گڵە، ئەولای گڵە، ناوەراستەکەی فێنکی دڵە؟))

(جەڕەی ئاو-کوپە- جەلحە- شەربە)

((سوورەی سەر سەقەت، دایەڵمە دوزەقەت، بخوسێت چەرمە رەقەت؟))

(ئاو لە گۆزە بخۆنەوە)

((لە بەینی دوو گردۆکان، قۆڕە قۆڕی گۆلکۆکان؟)).

(قەناتی بیری ئاو وخوولخوولە)

((بە بەتاڵی دەچیتە ژووریّ، بە پڕی دێتە دەریّ؟)) (دەولکی ئاو)

((مردی کیر قیت؟)) ((مردووی کێر رەپ؟)) (مەسینە)

((کیر قیتی قوون فش؟)) (مەسینە)

((بەردەستی کەپوو درێژ، پێویستە لەبۆ دەسنوێژ ؟)) (مەسینە)

((ژ حەلەب و وانێ تێ، بو قوینا بابێ تە تێ ؟)) (ئاڤە مەسینکێیە)

((هۆ دکەت، هۆ دکەت، بۆ دەرێ قووینا تە شۆل دکەت؟)) (مەسینە، مەسینك)

((هەتا دوو پلانی نەبەنێ ناکەوێتە کار؟)) (مقەس)

((هەتا پەنجەی لە قوونێ ڕانەکەی ناڕوات؟)) (مقەس)

((هەتا پلی لۆ قوونێ نەبەی کاوێژێ ناکا؟)) (مقەس)

((دەستی لە چاوی رابکەی، دەمی دەکاتەوە؟)) (مقەس)

((دەستی بۆ ئەبەی دەمی دائەچەقێنیٚ ؟)) (مقەس)

((پەنجە ئەکەی بە قنگیا، دەم دائەپچڕیٚ ؟) (مقەس)

((تا تیلکی پێوەنەکەی ناجووڵیٚ ؟))، ((دەستی بگەینییٚ دەلەوچی؟)) (مقەس)

((کاوڕە ڕەشی سەربانی، گیا دەقرتێنیٚ بەددانی؟)) (مقەس)

((مەڕە کۆرە( کوێرە) هەڵدەگەڕیٚ، دادەگەڕیٚ دەلەوەڕیٚ ؟)) (مقەس)

((داری دوو لك، پڕ لە کوڵك؟)) (جەو، کەلەخ، برینگی مەڕ و بزن بڕینەوە)

((کاوڕم گیسکی سەر بانی، گیای دەقرتاند بە ددانی؟))

(برینگ،کەلەخ، جەوی بڕینەوەی خوری مەڕ و مووی بزن؟؟ ؟)

((لەسەر ڕا هات نارنارۆکە، لەژێر ڕا هات نارنارۆکە، نە مریشکە نەباڕۆکە، دەهەڵیدە مام بالۆکە؟)) (خەڕەك)

((سیٚ بەرە، سێپەکی دارە، بازی هاوێژتە چنارە، هەتا چنار دەلەرزی، ئەو دەیگرت گۆشت و بەزی؟))؟؟؟ (خەڕەك رستن)

((چەرم و ئاسن و کدوولە، وێیدێخن رەشی دوولا، سەرگەورە کردییە قووڵە؟))

( دۆخ،خەڕەك)

((دار لەبان دارە، ئاسن جڵەودارە؟)) (تەشی)

((دار لەداربی ، ئالقەی لیٚ بزماربی، پەتێکی لیٚ هەوساربی؟)) (تەشی)

((دار لە داری، پەتیلۆکە هەوساری؟)) (تەشی)

((دار لەداری سوار، پەتك هەوسار، ئاسن لە زار؟)) (تەشی)

((چنارێكە و بانێكە و گۆچانێكە؟)) (تەشی)

((بانێك لەسەر چنارێكە، لەسەر بانەكەش گۆچانێكە؟)) (تەشی)

((چنارێكی بەرزە بەرداشێك لەسەر، گۆچانێك لەسەر بەرداش وەستاوە، گۆچان بە ریشمە لووتی بەستراوە؟)) (تەشی)

((بنی ئەسپیندارە، ناوەندی دەستاڕە ، سەری گۆپارە(گۆپاڵە)؟)) (تەشی)

((لە بنی ئەسپیندارە، لە ناوەندی جۆخینە، لەسەری گۆپارە؟)) (تەشی)

((سەری گۆپاڵە، نیڤەكێ بێدەرە، بنی تیرۆكە؟)) (تەشی)

((تشتێ منۆ ، دڕەقسیت، نە دخۆت، نە ڤەدخۆت؟)) (تەشی)

((خولخولۆكەیە دەستت بە ساقی، جا بێرە دیار گەمە و مەزاقی؟)) (تەشی)

((هەر بای دەدەی و قورس دەبی؟)) (تەشی)

((سمۆرەی سەر دارێ، خۆی هەردا سەر چنارێ، هەتا چنار دەلەرزی، سمۆرە دەگری بەزی؟)) (تەشی رستن، خەڕەك رستن)

((ئاسن و بەن و گلۆلە، تێم یەخست ڕەشی دوولا، لێم خوڕی كردیە قولە؟))
(كارگەی جۆلاً)

((چار سەد سواری تەورێزی، لەبەر یەك سواری دەلەرزی؟))
(داوی تەون و پیشك)

((سێسەد سوار لەبەر سوارێكی دەلەرزی؟)) (فرێتی تەون و پیشك)

((ئەو كونە ڕەشەی بەتۆوەوە، ئەو مژانەی بەمنـەوە، خـۆم تـیٚ كوتـا بـە گونـەوە، زیكە زیكە لەبنەوە؟)) (جۆلآیی كردن)

((لەو قۆرتیٚ بەتۆوە، لەو مژانیٚ بەمنەوە، خۆت داویمّی بەگونەوە، ترپ و هۆڕە لە بنەوە؟)) (جۆلّەیی و چنین)

((یەكت لیٚ دەكـەم (1)، یـەكت لـەبن زگـی ڕادەكـەم (2)، یـەكت لـەبن كلكـی دەنـیٚم (3) دووت پیٚوە دەكەم (4)، دووت لیٚوە دەكەم (5) دووی دیـت بەسـەر قوونـیٚدا شۆڕدەكەمەوە، بەهیشكی تیٚت دەنیٚم، بەتەڕی دەری دیٚنمەوە (7) ؟))

وەلأم : (1) یــەك زیــن لــە ئەســپ دەكریٚــت. (2) تەنگــە كــیٚش (تەنگەبەنـد) (3) قوشـقوونە (پـارو، ژیٚركلكـە). (4) ركیٚـب (ئـاوەزەنگ)، (5) ڕیٚـشمەو دەسجلّەو، (6) گولّنگەی پاشكۆی زین، (7) لغاو.

((یـەكی ئـەدەم لـە بـەر بـڕی، یـەكی ئـەدەم لـە دەم تـڕی، دووانـی پیٚـدا شـۆڕدەكەم، بـە وشكی پیٚیدادەكەم، بەتەڕی دەری دەكەم؟)) (بەرسینگەو پارو و ئاوزەنگ و لغاو)

((لەبەرڕا وەسەری دەكەم، بەوشكی دەزاری دەنیٚم، بەتەڕی دەری دیٚنمەوە؟)) (لغاو)

((یـەكیٚكی لیٚ ئەكـەم، دوانـی پیـا بەرئەدەمـەوە بـە وشـكی تیٚیئەخـەم، بەتـەڕی دەری ئەهیٚنمەوە؟)) (زین و لغاو)

((یەكی لە پشتیٚ، دووی پیٚوە شۆڕئەبیٚتەوە، یەكی لەبن كلكی، بەوشـكی تیٚـی ئـەنیٚن، بەتەڕی دیٚتە دەریٚ ؟)) (زین و لغاو)

((دوانــت لیٚ هەلّكیٚــشم، دوانــت لیٚ ڕاكیٚــشم، بەوشــكی تیٚــت ئەخــەم، بەتــەڕی لیٚــت دەركیٚشم؟)) (زین و لغاو)

((یەكت لیٚ دەكەم، دووت پیٚوە دەكەم؟)) (زین و ركیٚب وئەسپ)

((ئاسمانی چەرمین، پلیکانی ئاسن، پێیدا وەسەرکەوتین؟))     (زین، ئاوزەنگ)

((باڵەخانەی گۆشتین، پێبلکەکانی ئاسن؟))     (ئەسپ و ئاوزەنگ)

((قەڵاتی گۆشتن، پێبلقەی ئاسن؟))     (ئەسپ و رکێب و زین)

((کەپر چەرم، پیٚپەلیسك ئاسن؟))     (زینی ئەسپ و رکێب)

((لەگەڵ تــۆمە وەستای حــەوش، بۆم دروست کە جــووتیٚ کەوش، نە دەرزی کاری لیٚبکا  نە درەوش؟))     (رکێب، ئاوزەنگ)

((هەندۆکە و مەندۆکە، لەپێش سواران دەڵێی بووکە؟))     (قەڵپووزی زین)

((سوار لەسەر سوار سواردەبی؟))     (سوار لەسەر زینە، زین لەسەر هەسپە)

((چوار پیٚ لە حەردی، دوو لە تەنیشتیٚ، قنگ لەبن کلکیٚ، کیر لەسەر پشتی؟))
(پیاوێك سواری ئەسپ بووە)

((چوار پیٚ دەر زەمین، دوو پیٚ دەر تەنیشت، کیر لە ژێرەوە کوز لەبانی پشت؟))
(ئافرەتێك سواری ئەسپ بووە)

((چوار پیٚ لە زەوی، دوو پیٚ لە تەنشت، (گون) لەناوگەڵێ ،قوز لەسەر پشتیٚ ؟))
(بووکێك سواری ئەسپ بووە)

((ڕۆژەکی چوومە دەشتیٚ، دەعبایەکم گەیشتیٚ، چوار لاق لە عاردی، دوو لە تەنیشتیٚ، گون لەبن زگی کیر لەسەر پشتی؟))     (کوڕێك سواری ئەسپ بووە)

((ئەمڕۆ چوومە دەشتیٚ، دەعبایەکم گەیشتیٚ، قوز لەبن کلکی، گون لەسەر پشتیٚ))
(پیاوێك سواری ماین بووە)

((کەوەڵا و کەوەڵ، ناوێکیان هەیە، شەش پا و دوو سەرە، چاوێکیان هەیە؟))
(کوێرێك سواری ئەسپێکی یەك چاوە)

((که هەڵی ئەگرن ئەزریکێنیٚ، که دایئەنێن ژێرئەبێتەوە؟)) (قەڕاسه، زنجیر)

((شرینه لەدار ڕنه، دار ڕنه له گویٚ بەله، گویٚ بەله بەڕیٚ کەوی، پیٚ پانۆك به دوو کەوی؟)) (تریٚ ڕنین و کاروانی تریٚ)

((شرینی شاری، هنگڤینیٚ داری، گۆهبه لیٚ ب ڕێدا، پیٚ پاڵەی ب دیڤدا؟))
(کەر و باره تریٚ و کاروانچی)
((شرینۆك ل دارینۆك، دارینۆك ل گۆهبەڵۆك، گۆهبەلۆك ب ڕیٚ کەت، پیٚ پەحنۆك ب دیڤ کەت؟)) (تریٚ ییٚ دسەلکادا، سەلك سەر پشتا کەریٚ)

((نه ناڵه نه بزماره، پێچ پێچۆکەی هەزاره؟)) ( قەرتاڵە–لاگیره– ریٚ – رووبار)

((نەچاندی له نەزای بکەی، نەزای له نووستی بدەی))
(خویٚ ناچێندریٚ له هێستری نەزۆك باربکەن و له رووباری نەنووستوو بپەڕێتەوه)

((دینم له نەڕوای، باردەکەم له نەزای، دەڕۆم له نەبڕای؟))
(کاروانی خویٚ هێنان کە لە هێستر باردەکراو بە ڕێگەدا دەڕۆیشتن و لە رووبار دەپەڕینەوه)

((شەشت به شەشی، دوازدەت به کونه ڕەشی، لەسەر بیست و چواران دابەشی؟)) (بزمار و ناڵی وڵاخ)

((خشته کونێکه، 40 مەن بارییه، بۆ خۆی بیٚ گیانه، گیاندار سوارییه، گیاندار بەوەوه توانای غارییه، گەر ئەوەی نەبیٚ دەردی کارییه؟)) (ناڵ)

((بێری چار کچ هەیه، هەر کچەکی شەش کون هەیه، هەر کونەکی مێردەك هەیه؟)) ؟؟؟ (کون و بزماری ناڵی وڵاخ)

((گۆزەڵەی شەش کون، شەشی مەن بارییە، خۆی ئادەم نییە، ئادەم سوارییە؟)) (ناڵ)

((کونە گردەڵەی نۆمەن باریەتی، خۆی رۆحدار نییە و رۆحدار سواریەتی؟)) (ناڵ)

((لە دار ئەکریٚ، لەبەرد ئەکریٚ، وەکو ئەسپ زین ئەکریٚ؟))

(پرد– کەپرۆکەی تەون)

((شۆل نینە خوا چانەکا، فێر نینە بەندە نەکا، زینیٚ لە شێران دەکا؟)) (پرد)

((گلۆڵەی بایە، تێمهەڵدایە، بۆ بەغدایە، قەت نەبڕایە؟)) (رێگا)

((تاڵێك ئاوریشم ، بەغدا و بەسڕای پیٚ رائەکێشم؟)) (رێگە)

((لێرەڕا هەتا بەغدا، هەموی ئاوریشمی یەکلا ؟)) (رێگە)

((دچت سەریٚ چیای، نالڤلڤیت؟)) (رێگە)

((دە پێی و سیٚ سەر و دوو کلك؟)) (جوتە ولاٌخێك و جوتیارێك)

((دە لاق وشەش چاو، ناوقەد دار و پشت پیاو؟)) (جوت و جوتیار)

((دوو لە دو هەشتان دەچن؟))

(دوولاقی جوتیار بە دوای هەشت پەلی جووتە ولاٌخەکەی دەڕوات)

((چوار گوێی هەشت پیٚ، دار لە دو قوونیٚ؟)) (جوت و ئاموور، هەوجاڕ)

((چواری گوێیە، هەشتی پێیە، بووك لەوێیە؟)) (جوت و گاسن)

((چواری چاوە، هەشت هەنگاوە، دار لە دواوە، گلدڕەی ناوە؟)) (جوت و ئاموور)

((شەش چاو و شەش گوێیە، سێ سەر و دە پێیە، چواری چاوە، دار لەناوە، دە شاقاوە(دە هەنگاوە)،گڵ دڕەی ناوە ؟))(جوت و جوتیار و نیر و دارکراوە و ئامور)

((شەشی چاوە، دە هەنگاوە(شاقاوە)، بۆ دڕەی ناوە، ناوی دارە، کلکی خوارە؟)) (جوتە وڵاخێك و جوتیار و ئامور)

((چار دەزەقن، چار دەڕەقن، هەشت دەچەقن، نۆت پێوە، هەژدەت تێوە، لێرە وێوە؟)) (چوار چاو و چوار قۆچ و هەشت پەلی جوتێك گا)

((چاریان چاون، داریان لە ناون؟))

(نیری جوت چوار کونی تێدایە و چوار دارکلاوەیان لەناوە)

((هەر لە سبیانێ هەتا ئێوارێ، خۆر(خۆڵ)ێ بە سەرێ خۆ دادەکا، ئێوارێ دێتەخوارێ، جوانترە لە کابانێ مارێ ( ماڵێ)؟)) (گاسنی جوتکردن)

((سۆردەکرێتەوە و ناشخورێ؟)) (گاسن، ئاسن،...)

((هەلۆتر و مەلۆتر، سینگ سپیێ( سەرقازی ) مل کۆتر، لە هەموو زەویان دەگۆتر.؟)) (داسی درەو، مەڵەغان)

((ماینێ مەلایە، بەرمدایتە چیایە، نەیهێشتییە زلەك گیایە؟))

(داسی درەو یا مەڵەغان، گیزانی قژ تاشین)

((مام حەسەنی بە لنگەکی، دەچتە شەڕێ گوندەکی؟)) (داس، مەڵەغان- بیور)

((سەگی هار پەڕییە بان دار، پەلوپۆی هێنایە خوار؟)) (تەورداس- بیور)

((یەك پێ لە دەشتێ، دوو پێی گەیشتێ، خستییە ( وەریگێڕا) سەر پشتێ؟))

(تەبارەی گەنم و سەپان و دروێنە کردن)

((دەدە ناکەم، بەبە ناکەم، بەعیساکەم، بە موساکەم، هەردوو لنگی لە حەواکەم، زیڕوهۆڕی لێ پەیداکەم؟)) (لە کاتی بارکردنی شەغرە،دوولاقی بەرزدەکرێتەوە و دارەکان زیڕ و هۆڕیان لێوە دێ)

((خاڵێکم هەیە لە دەشتێ، ژن دەیهێنێتەوە بە پشتێ ؟))

(قڵشە وگیاو دار و چیلکە هێنانەوە)

((ئەم لای دارە و ئەولای دارە، تێیدایە دوو گوجیلەی هارە؟)) (جەنجەڕ)

((ئەم لای دارو ئەو لای دار، تیایەتی دوو گورگی هار؟)) (جەنجەڕ)

((چواری گوێیە، هەشتی پێیە(بوك رەوێیە)، دەری دارە، پڕ بزمارە، لە ناوی‌دا گورگە هارە؟)) (جوتێك ولاخ و جەنجەڕ)

((چوومە سەربانەکی، من بەرێ خۆدا ئاقارەکی، حەفت بەق ددەڤێت مارەکی؟))

(شەنەی حەفت لك)

((چومە ڕێکەکێ، ڕێ لە دارەکێ، حەفت کلیلن ددەڤێ مارەکێ؟))

(شەنەی حەفت لك، (ملهێب)ی حەفت گوهە)

((چوار ئەنگوست و باسکێك؟)) (شەنەی چوار لك- چەنگاڵ)

((خاڵۆیەکم هاتووە لە نهۆنێ، کیرو گونی ها بەکۆڵێ؟)) (ڕەشکەی کا کێشانەوە)

((ڕەشی گرێ گرێ، ئەگەر نەزانی قوونت خورێ ؟)) (ڕەشکە، داو، شەڵتە)

((هەر لێرە هەتا بەغدایە، هەمووی گوریسی یەك لایە؟)) (ڕەشکە، شەڵتە- ڕێ)

((عەبایەکم هەیە لە دەشتێ، حەودسەد کونی لە پشتێ ؟)) (ڕەشکە، شەڵتە)

((1، 2، 3، 4، عەرەبانەی بێ بزمار، لێك تێپەڕی سەدهەزار؟)) (ڕەشکە)

((بە حەمە شەپڵتەو بە حەمە هەولێری، هەندیان دا لە قەزنە کێری، ڕەقیان کرد وەك شاخە( قۆچە) نێری؟))                    (شەڵتەی(کا) داگرتن، داو، تایخە)

((مەیلەکم هەیە مەیلانی نە پێی هەیە نەپانی، بە هەموو ماڵان ئەزانی؟))
(دەستاڕ– دراو)

((ڕەق لە سەر ڕەق، ڕەپ تەکونیٚ، ئیشی ژنیٚ؟))                    (دەستاڕ)

((زگ لە سەر زگی، دەستت لە گونی، کاری ژنی؟))                    (دەستاڕ)

((تەپ لەسەر تەپی، دەستت لە ڕەپی؟))                    (دەستاڕ)

((پانکیٚ لەسەر پانکیٚ، دەستت بە بەلکیٚ؟))                    (دەستاڕ)

((سندریکا ل سەر سندریکیٚ، کلیل ل دەستیٚ بیکیٚ؟))                    (دەستاڕ)

((بەرەك ل سەر بەرەکی، تەیرەك دخونیت ل دۆلەکی، کونا قوونیٚ ل نیڤەکیٚ؟))
(دەستاڕ)

((چومە ئۆدا ژێری، من دیت ژنا سەر مێری، م گۆت دیٚ چ کەی حورمەتیٚ، گۆت: ڤی مێری، دئینمە نێری؟))                    (دەستاڕ)

((چومە مالکێت ژێری، ژن خۆ دهاڤێت سەر مێری؟))                    (دەستاڕ))

((چومە دەشتیٚ ژێری، مێم دیت لەسەر نێری؟))                    (دەستاڕ)

((ئەتبەمە لانەکا حاسیٚ، دکونێت دکوتم لولیا داسیٚ ؟))                    (دەستاڕ)

((ماینیٚ شێیە، لە حەوشێیە، دەحیلێنی، خوێن دەڕژێنی؟))
(بە دەستاڕ نیسك لە حەوشە ایٚبکەن)

((هرڤە بەر و وێڤە بەر، یێ دنیڤیدا میر عومەر ؟))                    (جۆنی و دەسکە جۆنی)

((هەتەرۆك و مەتەرۆك، سەری بابت کەچەرۆك (کەچەڵۆك) ؟))

(جوهنی، جۆنی و دەسکە جۆنی)

((چوومە سەر حەردێ، روانیمە زەردێ، دارێك بە چەپۆك بەربۆتە (هەنگژایتە)
بەردێ)) (چەکەنەی ئاشی ئاو)

((وەك شاخە نێری هەڵئەپەڕێ کێری)؟)) (چەکەنەی ئاشی ئاو)

((زمانی لە پشتێ، کلکی لە تەنیشتێ، رزقی لە دەشتێ؟)) (ئاشی ئاو)

((هێزی لە ئاوە، زاری لە پشتێ، بۆخۆی لە بەردی، رزقی لە دەشتێ ؟))
(دۆڵەدانە و بەرداش و کارکردنی ئاشی ئاو)

((هەڵێنە، مەڵێنە، دارەکەی بچەقێنە، ئاردەکەی هورد بێنە، وەك کل بە چاوتی
دابێنە.؟)) (ئاش و گەنم و ئارد؟؟؟)

((ئەسپی تۆپیو جۆ ئەدات؟)) (دان ئەکاتە ناو دۆڵەدانەی ئاش یا گەرۆمەی دەستاڕ)

((بۆخۆی لە چەمانە ئالیکی لە گوندانە؟)) (ئاشی ئاو)

((بۆخۆی لە شارانە مووچەکەی (خواردنی) لە گوندانە؟)) (ئاشی ئاگر)

((هندی بکەنێ تژی نابت، هندی بدەنێ تێر نابت ؟))
((هەر دەخوا و تێر نابی؟)) (ئاش- مقەس- ویستەکانی مرۆڤ)

((هم همۆ، لبەر چەمۆ، نەدز دبەن، نە گور دخۆ؟)) (ئاشی ئاو)

((هندی دبەزیت ، ژ جهێ خۆ ناچیت؟)) (ماتۆڕی ئاو- ئاشی ئاو-مەشکە...)

((پاشیاوی شل دەڤی، ژ جێێ خۆە هەلەڤی؟)) (ماتۆڕی ئاو- ئاشی ئاو-مەشکە)

((گیسکیَ گوڕی، سەر ئاڤیَ(رووباری) خوڕی؟)) (ماتۆڕی ئاو– ئاشی ئاو)

((گیسکیَ گڕی، دەر (پەڕیَ) ئاڤیَ(رووباری) تەمڕی؟)) (ترومپای ئاو لە دەم چەمانە)

((ئاڵدم باڵدم، شەش پێی دووسم، پۆپیتەی دەگرم، ئەگەر نەیزانی پێی دادەفسم؟))، ((شەش پێنە و دوو سم؟)) (تەرازوو، تەرازی، میزان)

((هەڵم و پەڵم، شەش پا و دووسم، پۆپیتەیدەگرم، پێیدا دەفسم؟)) (تەرازی)

((شەش بەند و بەندیلکەك، دارەك و دوو دەول (دەف) و کوتیلکەك؟)) (تەرازی)

((شەش بەندو بەندیلەك، دوو نان و کوتلکەك؟)) (تەرازی)

((شەش پێیە، دوو پانینە، مل یەکە، لە بانینە؟)) (تەرازوو، تەرازی)

((سیَ بەن و دەفەك، دوو دەف و دارەك؟)) (تەرازی)

((دوو بەند و بەندەکە، دوو دەف و دارەکە؟)) (تەرازوو، تەرازی)

((بەندەك و دارەك، شەش بەندك و دوو دەپ؟)) (تەرازی)

((هەلینگە و مەلینگە، شەریفۆکەی شەش لینگە؟)) (تەرازوو)

((پەراسووی هەیە گۆشتی نییە، هەناسەی هەیە رۆحی(رەوانی) نییە، مەمکی هەیە شیری نییە؟)) (کورەدەفێن، کورەدەمێن)

((کارت پێیبیَ فرێی ئەدەی، کارت پێینەبیَ هەڵیئەگری؟)) (تۆڕی راوە ماسی)

((زیندوو هات بەفێڵ، مردووێکی ناشت، بەری دارەکەی ئادەمی لیَ ناشت، زیندوو بۆ خواردن هاتە سەر مردوو، مردوو هەڵبەزی، زیندوو پێوە بوو؟))

(داو، تەڵە، فاق دانانەوە)

((مردوو زیندوو دەگریٚ ؟)) (تەڵە، داو، فاق)

((تشتەك من هەیە دریٚدا، یێ ساخ هات پێدا،یٚیٚمری یە ساخ لە ئەردیدا؟))
(داو، تەڵە، خەفك،

لكۆ، فاق)

((بەرەو بایە روو لە خوایە؟)) (كۆلارەی منداڵان– كولانكە،كلاورۆژنە)

((نەدەمی هەیە نە ددان، فیكە لیٚ ئەدا وەك شوان؟))

(فیتفیتەی منداڵان، تووڕتووڕە–مازوو)

((خڕە وەك (...)ی باوكت، شەقە وەك (....)ی دایكت؟))

(زەنگۆل – قۆزاخەی پەمۆ– بەری دڕكە كەبەر)

((لیٚو دارۆكەی ناو چەرمۆكە، تیتل و پیتل و زڕزڕۆكە؟)) (دەفە)

((سەمای دەكاو بەخۆی دارە، چەرمە خڕەی گویٚ بەگوارە؟)) (دەفە)

((ڕەقۆكە چەرمۆكە، پەتیتلە و زەنگڵۆكە؟)) (دەفە)

((كەلەخ لە دارۆكیٚ، ناوەند لە چەرمۆكیٚ، تلیلیلی لە لەرزۆكیٚ ؟)) (دەفە)

((سەر دارۆكە بن دارۆكە، یا دبنڤە تری وریٚ یا ب زریۆكە؟))؟؟ (دەفا دەروێشی)

((دەچوومە نۆكاران، دەمكوتا بەداران، گرمەی دەهات وەك هاران؟))؟؟؟ (دەهۆڵ)

((تا لیٚی نەدەی دەنگی نایە؟)) (دەهـۆڵ)

((سەگی ئەحمەدەلۆكی ( بە دەسكی حەمەدۆكی)، لـە هـەموو دەركان دەكـۆكی؟))
(دەهۆڵ و دار دەهۆڵ)

((حەفتێ و دوو زمان دەزانە، لە ئەو تشتەکی بێ جانە؟)) (رادیۆ– ئامێری سان)

((دارا چل ئاواز؟)) (ڕادیۆ– تەلەفزیۆن)

((دارێکم هەیە دەنێو داران، دەنگی دێ وەك بزن و کاران؟)) (زوڕنا)

((چێوی ئامە، ئائی نەنە، سەری چەشمەش ئائو نەنە، چێشان چێشان مەوزووش پەنە))
(زوڕنا)

((کشتەك هەیە کشتۆنە، تیزو فیزو زرپۆنە، گوست و نینۆك قادۆنە؟))

(جووتـە، پیـك و دووزەلـە)

((ڕیزە ڕیزە دار چەماوە، گەلاّ پشتی چەرمی خاوە، مردووە و زینـدووێکی لـە ناوە؟))؟؟؟؟ (قەفەز و کەو)

((دارەکە دارێکی چەماوە، دەورە دەوری چەرمی خاوە، مردووە و زینـدووێکی لە ناوە؟)) (قەفەز و کەو ، بولبول)

((دەهـ دار و دوو بەن، ئێخسیر تێدا بوویە رەبەن؟)) (سویتا کەوا، داو، تەپکە)

((سێ برانە بەدوای یەکدی غاردەدەن هەرگیزاو هەرگیز بەیەکدی ناگەن؟))

(پانکەی سێ پەڕ)

((بە سێ برا قاچێکیان هەیە؟)) (پانکەی سێ پەڕ)

((بە چوار برا سەرێکیان هەیە؟)) (مێز و کورسی)

((بەچوار برایان مێزەرێك؟)) (مێز)

((مردووی جل بە کۆل، چوار پەل قایمە، زستانە و زستان مالە پایمە؟)) (کورسی)

((مردی دوو قوون))، ((خڕی دوو قوون؟)) (باگوردان)

((قوون بەردی کیر ئاسن(دار)؟)) ،((شەو لە بانە؟)) (باگوردان)

((هاوینان دەنویٚ دەجیٚدا، زستانان دەڕوا دەڕیٚدا؟)) (باگوردان)

((هاوینان میرە، زستانان کارەکەرە؟)) (باگوردان)

((هاوینان دەخەویٚیە، زستانان لە سەر پیٚیە؟)) (باگوردان)

((ئەز چومە سەر گری، کیٚ دیتییە دەوریٚ حەفت زەمان، دار خۆ بهاڤیٚتە بەری؟))
(باگوردان، بان گیٚر، باگۆرە)

((تشتۆ تشتۆ، لدیڤ من وەرە، نە ماکەرە؟)) (باگوردان، بان گیٚر، باگۆرە)

((کەرۆ، کەرۆ، کاییٚ دکەم بە رۆ، هیٚدی هیٚدی دیٚچمی وەڕۆ؟)) (باگوردان)

((کەری مام هەیدەرە، جهورەکیٚ کایێ من دانا بەرە، قڕیش ل دویڤ من وەرە؟))
(باگوردان، بانگیٚر)

((پیرە مامیٚ لە تەلانیٚ، لۆلکیٚ دەخوا بەزمانی؟)) (باگوردان)

((مامەکم هەیە لەسەربانیٚ، پەلوی قوڕ(ماش) دەخوا بەبیٚ نانی؟)) (باگوردان)

((یەکت لیٚدەم، دووت پیٚوە هەڵواسم، ئاوت دەربینم مام قاسم، لە هەموو سەربانیٚك دەتناسم؟)) ( باگوردان)

((بەگزادەی هەڵە دەنیٚ، جووتی خالیٚ لە گەردەنیٚ ؟)) (باگوردان)

((لووسی دوو کون، دوولکی دوو گون، سەری پیٚ چاکەن، بن پیٚ خۆشەبن؟))
(باگوردان و دەسکە باگوردان، بانگیٚر)

**((له ئاویٚدا دەژی، هەردەم تیٚنییە( تیٚنووە)، له ئاویٚ دەربیٚ پیٚی نییە، تیٚر ئاو بخواتەوە مردییە؟)) (بەلەم، کەشتی)**

**((دارە، پیٚیبزمارە، کەر لیٚی سوارە؟)) (بەلەم، کەشتی)؟؟**

**((دوو برایە بەدوای یەکتری ڕادەکەن، قەت ناگەنە یەکتری؟))**

**(ئەسپە ئاسنینە، دووچەرخە، پایسکل)**

**((ئاسنی بەیبوونیٚ، تاویٚتۆ پشت ستوونیٚ ؟)) (پیٚمەڕە)**

**((هەتا بیبڕی دریٚژ دەبی؟)) (جۆگەلە)**

**((هەتا لیٚی وەربگری گەورە دەبیٚ، هەتا بیدەیتیٚ گچکە دەبیٚتەوە))(چاڵ، کۆرت)**

**((چەندی ژیٚ راکەی مەزن دبیت، هەندی تو ب کەییٚ سەر دیٚ بچویك بیت؟)) (چاڵ)**

**((لیٚی هەڵ ئەگری زیاد ئەکا، ئەیخەیە سەر کەم ئەکات؟)) (چاڵ)**

**((زگی پڕە لەسەر خۆیە، لە چیت پڕکردووە ئی تۆیە))**

**(چاڵی گەنم و جۆ و هەرزن)**

**((زگی پڕە، بیٚ سیٚبەرە؟)) (چاڵی گەنم)**

ڕووەکی کوردستان زۆر و هەمەجۆرن، مێژووش بە بەڵگە سەلماندوویەتی کە یەکەمین جار لە ژیانی مرۆڤایەتی‌دا کشتوکاڵ و ئاژەڵداری لەم وڵاتەدا سەری هەڵداوە، هەڵبەتە مرۆڤیش بیر لەو شتانە دەکاتەوە کە لە ژینگەکەی خۆی دەیبینێ و لەگەڵیاندا دەژی، بۆیە زۆربەی ڕووەکە سروشتییەکان و چێندراوەکان و بەرهەمەکانیان لە نێو مەتەڵەکانیاندا دەبینینەوە:

((سەری هەسانە، بەری قورئانە؟)) (کارگ[1]، قارچك)

((سەری لووسە وەك هەسان، بنی پەڕ پەڕە وەك قورئان؟)) (کوارگ، قارچك)

((سەرش هەسان، چیریش قورئان؟)) (کارگ، قارچك)

((دیوێکی هەسانە، دیوێکی قورئانە؟)) (کوارگ،کارگ، قارچك)

((شتێکم هەیە سەر کڵاوانی، لەبنی پەڕپەڕی قورئانی؟)) (کوارگ، قارچك)

((قورئانی بنێ دنیێ هەندی مەلاو فەقێ دچنێ، ناهێتە خوندنێ؟)) (کارگ)

(( قورئان ل بنێ دنێ، چەند شێخ و مەلا هاتنێ، نەشیان بدەن خاندنێ، دهێتە خارنێ؟)) (کوارگ،کارگ، قارچك)

((سەر لووسی بن پەراسوو؟)) (کوارگ،کارگ، قارچك– بان و بنمیچ)

((بەرخەت خەتێ، پشت خیوەتی؟)) (کوارگ،کارگ، قارچك)

((تاوڵی(چادری) یەك ستوون؟)) (کوارگ،کارگ، قارچك)

---

1- هەرچەندە کەڕوو و کوارگ و دومبەڵان، بە پێی پۆلینکردنی نوێی زیندەوەران و گیانداران، بە کۆمەڵەیەکی سەربەخۆ دادەندرێن و لە ڕووەك جیادەکرێنەوە، بەڵام ئێمە لێرەدا هەر وەك پۆلینکردنی کۆن لەگەڵ ڕووەکمان نووسیون.

((چوومە شارێ شك تێنینە، من گۆشت خار هێسك تێنینە؟))   **(کارگ–مەمك)**

((باوك ئاوە، دایك خۆڵە، منداڵێکە (ئەرێ ڕۆڵە) خەپە تۆڵە؟))   **(دومەڵان)**

((خاش خاش و کوز کوز، چەتری بێ تەناف، دیرەکی داری چۆن هەسونی ساف، لەشامە نییە لە شیراز ئامان، بە خونەی شەونم بەهار دەرئامان)) **(کوارگ)**

((دەفڕی و باڵی نییە، سەری دەبڕی خوێنی نییە؟))

**(قەلقەلاشك، گەڵا–کۆڵلارەی منداڵان–ئێستا فڕۆکە، بالۆن و... دەگرێتەوە)**

((بەبەرگی سەوز و سوور، وەك چرای شیر و کاپوتی ژنامیر؟))

**(چڕۆ– دار گوڵ)**

((مردار دەبی و بەفر دەبارێ؟))   **(گەڵای دار دەوەری و زستان دێ)**

((هەر لێرە هەتا ئالقا، هەمی پنێت کالەکا؟))**(چروو،چڵوو، چڵی، گەڵای دار بەڕوو)**

((چاڵێکم کەند چل گەزی، عەدلەخانی تێبەزی، سەری پرە لە دەرزی؟))

**(کـــەنگر، کـــەرەنگ)** **((فاتمۆکـــەی سەربەکەزی، سەری پڕە لە دەرزی؟))**   **(کەنگر، کەرەنگ)**

((بیرەکا دڕیدا، هەزار کەلەم دڕێکێدا؟))   **(کەرەنگ، کەنگر)**

**((نۆمانگ لە زەوی، سێ مانگ بەدەرە، هەوەڵ بۆ ئادەم، دووەمین بۆ کەرە؟))**

**(رووەکی کەنگر نۆمانگ لەژێرزەوی دیارنییە، کە دەردەکەوێ و ناسکە مرۆ دەیخۆن و دەیکەنە چێشت، کە پیردەبێ ودەبێتە کەنگردڕك و ڕنك کەر دەیخوا)**

**((سنگی داکوتراو کوتەك نە دیتوو؟))**   **(کەنگر)**

((خانمی ل خانێ، کەزی لەسەر بانێ ؟))   **(پیفۆك، تەڕەپیان)**

((بۆخۆی لە بنەبانێ و کەزی لە سەربانێ ؟))

**(سەلکی پیفۆك لە ژێر زەوییە و گەڵاکانی شێوە کەزیین و لە سەر زەوین)**

((پیرە ژنێ حەفت کراس لەبەرە، هێشتا دەرێ سەرمامە؟)) **(پیفۆك، پیشۆك)**

((بابێ تەییێ مری، دحەفت مێزەرا وەرگری، سەرێ گرە کێرا کری؟))؟؟**(پیشۆك)**

((سەوزە وەك خیار، بەرزە وەك چنار، مزرە وەك هەنار، لە دێ (لە چیا)وە دێ بۆ شار؟))

**(ڕێواس)**

((سەرشینی موچك (هەنگوچك) سپی؟)) **(کووزەرە)**

((خوا نەیکردووە و هەس))، ((**خوا نەی کردووە و هەیە؟**)) **(قامیش، نەی)**

((هەڵدەستێ وەك فیتەری، کلکێکی لەبانی سەری؟)) **(قامیش، نەی)**

((کەنو لەبان کەنو، دەرگای هەنو؟)) **(قامیش، نەی)**

((هەر ئەڕواو پشتی ئەبەستێ؟)) **(قامیش)**

((رووی گەشە، هەناوی بۆشە؟)) **(قامیش)**

((جاجمە سەوزە، لە گوێ حەوزە، نە قەوزەیە، نە پیرۆزە؟)) **(چیمەن، فریز)**

((هەر لێرە هەتا عەزە، هەمووی مامی تۆبز گەزە؟)) **(گیایشەکرۆکە، کەرتەشی)**

((**هەر لێرە هەتا کەرماشان، گشتی دێوانەی کوتەك ( گورز) بە شان؟**)) **(کەرتەشی)**

((هەر لێرە هەتا دەرگەزێن... هەمووی سۆفی سەر لەرزێن؟)) **(شەکرۆکە)**

((باڵای سەوزە، رووی سپییە، چاوی زەردە؟)) **(رووەك و گوڵی نێرگز)**

((گۆپکەی زێڕینە، ناوتەنگی شینە، بنکی ئاخنینە؟)) **(نێرگز)**

((بنی ئاخینە، ناڤترەنگا(ناڤتەنگا) شینە، سەری زێڕینە؟))

**(بنی رووەکی نێرگز لە خاکدایە و ناوقەدی سەوەزە کڵاوەی گوڵەکەشی زەردە)**

((زەردە زڕنیخ نییە، سپییە پەنیر نییە، کەسکە شووتی نییە، بۆشە قەبە نییە))

**(نێرگز)؟؟؟**

((شین وەشینی، زەردە وەك زێڕی، سپییە وەك پەنیری؟)) **(نێرگز)**

((بن یێ شینە، سەر یێ سپییە، کولاڤ زێڕینە؟)) **(نێرگز)**

((زەردە وەك زەعفەران، سپییە وەك بەفری کەلان؟)) **(نێرگز)**

((چوومە سەر گردەکی، هەزارم دیت لە ڕەنگەکی؟)) **(کڵووك،کوریك–مێروولە)**

**((هەر لێرە هەتا کەرکوك، هەمووی روومەت سۆر وسپی وەك بووك؟)) (کلووك)**

((بێ درانە( ددانە)، گەز دەکە، کێ دەزانی، ئەو چکە(چییە)؟)) **(گیای گەزگەزکە)**

((نە لەملایە، نە لەولایە، دەناویدا نەرمە گیایە؟)) **(دوڵ و گیای بەهار؟ ؟)**

((خاڵێکم هەیە لە دەشتێ، ژن دەیهێنێتەوە بە پشتێ ؟)) **(گیا،دار وچیلکە، قڵشە)**

((لە بنی قوڕینە(گڵینە)، لەناوەندی چیغنینە(پووشینە)، لەسەری زێڕینە؟))

**(ڕەگ و قەد و گوڵ و دانی گەنم)**

((بنی دەگڵی، قەدی دەکەرێ، سەری دەتوو، ئەگەر نەزانی چاوت دەرێ ؟))

**(ڕەگی رووەکی گەنم لە خاکدایە و قەدەکەی دەبێتە (کا) و کەر دەیخوا، دەنکی دانەکەشی کە لە نێوگەڵدایە و دەکەوێتە لای سەرەوەی بۆ مرۆڤە)**

((کەسکی گیایە، سپی شیرە، زەردی لیرە؟)) **(قەرسیل و فەریك و دانی قەگەنم)**

((کەسکە ڕەنگی گیای، زەرە وەك تیورۆژکێ، سپییە وەك بەفری، ڕەشە وەك ڕەژیێ ؟))

**(رووەکیگەنم، گەنم، ئارد، نانی سووتاو)**

((راچینم بەشینکی، تێئەکەم بەزەردکی، دەبڕم بەسپیلکی؟))

**(رووەکی سەوزی گەنم، تەبارەی فەریك، تەبارەی وشك ودروێنە)**

((خواردنێکە هەتا دووجار نەکوڵێ نایخۆن؟)) **(ساوار)**

((لە بازاڕی هیشکە، لە ماڵێ تەڕە؟)) **(ئارد و هەویر)**

((لەبازاڕی سپییە لە ماڵێ زەردە؟)) **(ئارد و نان)**

((چومە سەر گردەکی، فیتەم کردە شوانەکی، سی و سیّ مەڕ هاتن لە بەرانەکی؟)) **(هەویر وئەنگوتك کردنی ئافرەت لە سەر خوانەی نانی)**

((شلی توونت دەکا، گەرمی سارد دەکا؟)) **(نان لە گۆشتاو(نیسکێنە) دەکوشێت)**

((زەردە خۆر، زەردەخەنە، سەد قتوو لەسەر یەك قتووی بەنە؟)) ؟؟ **(کۆگوڵ و دانی گەنمەشامی)**

((مامکی منۆ، پسمیرێ ب شەپکەکی؟)) **(دنکا برنجی ب پووشە، چەڵتووك)**

((مامکی منۆ... حاکم ییٚ دین، بەرگیزاڤە؟))؟؟ **(دینکا برنجی ب پووشك)**

((بەگ زادەی بەرگ بووزی))، ((بەگ زادەی چۆغەر بووزی؟)) **(برنج، چەڵتووك)**

**((سەر لە زەوی، گوڵ لە حەوا، ناوی نوقڵە و بەرگی تەلا))** **(چەڵتووك)**

((هەراو هەراو، قنگ لە قوڕاو، کەپەنك لەشان، نوقڵە لەناو؟))

**(مەرەزە و چەڵتووك و دنکە برنج)** ((پێنج مانگ بەحرییە، بەخۆی حاکمە، بەرگی بووزییە؟)) **(مەرەزە،چەڵتووك)**

((ئەمەندۆکە، پڕ پندۆکە، لەپێش چاوان ئەڵێی بووکە؟)) **(برنج– دۆڵمە)**

((برنجا ب شەل و شەپك؟)) **(ئێپراخن، یەپراخ،دۆڵمە)**

((وردیلە وردیلە، لەبن بەردیلە، هەرکەس نەیزانێ ناوی ئەنێم بێچووە پشیلە؟))

**(دۆڵمە، یاپراغ)**

**((شتێکم هەیە سەوزی سەوزی، تەرسەقوڵ تەرزی؟))** **(یاپراغی بە گەڵامێو)**

((قەسری سپی دەمانچە لەسەر؟)) **(رانە مریشك لەبان پڵاو برنج)**

((بەگوڵی لەنگە، لەبەژنی شەنگە، مێردی کۆڵانی تەنگە؟)) **(هەرزن)**

((قوتۆ، قوتۆ، دەشتێدا، سینگی سۆری دپندیدا؟)) **(نۆك)**

**((هەندووکە بە دندووکە، خڕە و لەبارە، ڕەقە وەك دارە، کەپووشی خوارە؟)) (نۆك)**

((چوومە کۆزا کارا، هەمووی دم خوارە؟)) **(نۆك)**

((چوومە ڕێیێ بێلێڕیئارە، ڕەوە کەوەك تێدا، هەموو دمك خارە؟)) **(نۆك)**

((پیاوی سپلە، نەبەری هەیە نە پشتە؟)) **(نیسك)**

((دارەکم هەیە هەژ ل هەوە، پێی وەهاتن پێچکە کەوە؟)) **(رووەکی کونجی)**

((گوجەڵمە، گوجەڵمە، دووسەد گوجەڵ؟)) **(رووەکی کونجی)**

((هەلەجە، هەلەجە، بیست و پازدە دەرەجە؟)) **(رووەکی کونجی)**

((چل تاق، چل نێم تاق، پڕیەتی لە برنجی چاك؟)) **(رووەکی کونجی)**

((دچینین کێچ، ڕادبیت ڕم؟)) **(تۆو رووەکیکونجی)**

((هەپلە پان و هەپلە پان، گیاییێ شینە، پەلکی پان، کوڕێی پیرە بابێ جان؟))

**(رووەك و بەری پەمۆ، لۆکە)**

((جۆخینا لە پشتا بانی، کا چێترە ل دانی؟)) **(پەمۆ و پەموانە، لۆکە)**

((چاندم نۆك، شین بوو بی، پەلك پانی بەر هەرمی؟)) **(پەمۆ، لۆکە)**

**((چاندم موو، شین بوو توو، پەلك پان بەرهەمی؟))** **(تۆ و رووەك و بەریپەمۆ)**

((بە گەلاَ توو، بە پەل بی، بە بەرهەمیٚ ؟)) (پەمۆ، لۆکە)

((مە چاندن وەکی نۆکا، شین بوو وەکی سێڤە لۆکا، پێڤە هاتن وەکی گویزە لۆکا؟))

(پەمۆ، لۆکە)

((ژڤێریٚ پێدا، من عەجێبەك دیت دڕیٚدا، کیٚ دیت ماك دزکیٚ بەرخیٚدا؟))

(قۆزاخەی پەمۆ، لۆکە، دانی پەمۆ)

((خڕە وەکی (...)ی بابت، قەڵەشیوە وەکی (...)ی داکت؟))

(قۆزاخەی پەمۆ– بەری کەبەر، شەفەڵە– زنگوڵەی ملی مەڕ و بزن)

((وەك گونی بابت خڕە، وەك هی دایکت داقڵیشاوە، وەك ریشی باپیرەت سپییە؟))

(قۆزاخەی پەمۆ))

((چاندم رشك، شین بوو گویٚ مشك، بووە گەرەشك؟)) (تۆ و رووەکیتووتن)

((زەردی زەعفەران، باردەکەن لە هێستران، دەڕواتە ناو گاوران؟)) (تووتن)

((زەردی زەعفەران... نام لە ئێستران، بردم بۆ شاری کافران؟)) (تووتن)

((شینە وەك شنگی، تاڵە وەك پونگی، ئەگەر نەیزانی کلاٚوی منت بە قنگی؟))

(تووتن)

((شینە وەك شنگی، هاتە وەك پونگی، ئەگەر نەتزانی ئەو پلەت بەقنگی؟))

(رەیحانە)

((شتێکە بەزستان و بەهاوین، لەناو بەفر و لە کادین، هەر گەرمە و ساردنابیتەوە؟))

(بیبەری تیژ (دەلوجەیگەرم)

((شتەکی من شتەکە، کەویٚ سۆری قوتەکە، کەپوو خواری قوندەکە؟))

(رەنگ و بستەی بەری دەلووجە بیبەر) ((لە سەری ڕەشە، لە ناودا کەژە؟))

(باینجان)

((سەری کەسکە، پشتی ڕەشە، دڵی(زگی) سپییە؟)) (باینجان)

((ئەوە چییە، چی پێ دەڵێن، پەپکە بەکونجی پێ دەڵێن، عەبا نارنجی پێ دەڵێن؟))
(باینجانا سوور، تەماتە-پەپکە بە کونجی)

((شتەکی سۆری قورمزی، کونی نییە ئاویش دەدزی؟)) (باینجانا سوور، تەماتە)

((سەری سەیدە، ناوەندی مەلایە، بنی سۆفییە؟)) (تەڕەپیاز)

((سەری سپییە مەلا نییە، لەشی کەسکە سەید نییە؟)) (تەڕەپیازە)

((سەری کەسکە و سەید نییە، مەندیل سپییە و مەلا نییە؟)) (تەڕە پیازە)

((سەری کەسکە و بنی سپییە؟)) (تەڕە پیازە)

((سەرسەوزی بن سپی؟))، ((سەر شەهیدێ، بن مەل؟!)) (تەڕەپیاز)

((قەسری سپی، سواندووکە کەسك؟)) (تەڕە پیازە)

((کۆشکی سپی، سواندە(گوێسەبانە)ی سەوز؟)) (تەڕە پیازە)

((هەسپی سپی، باری کەسك؟)) (تەڕە پیازە)

((سەری لە ئەرزە، قاچی لە ئاسمان؟)) (تەڕە پیازە)

((سەری ئەبڕی و بۆی ئەگری؟)) ، ((سەری دەبڕی و پێیدەگرییێ؟)) (پیاز)

((پڕ بە دەستە و ئەیگـــری، هەر بۆخۆت سەری ئەبـــڕی، ئەوسا دواتر بۆی ئەگری؟))
(پیواز،پیڤاز، پیاز)

((یێ مری مرۆڤی ب گریان بەرددەت؟)) (پیواز،پیڤاز، پیاز)

((گچکە و خڕە پێی ناوێری، فرمێسك لە چاوان دەردێنی؟)) (پیڤاز، پیاز)

((گای سۆری حەفت چەرم، لۆی دەگرێی بەبێ شەرم؟)) (پیڤاز، پیاز)

((گاڕانەکا لەبەرمە، گۆلکی گچکەی حەفت چەرمە؟)) **(پیڤاز، پیاز)**

((چۆغەکەی دەبەری، کلاَوەکەی لەسەری، کی دیویەتی گای جووت چەری؟))

**(پیڤاز، پیواز، پیاز)**

((خان و مان کچە پاشایە، سی و دوو کراسی لەبەردایە؟)) **(کەلەرم، پیاز)**

((مامەیەکم هەیە لەقوونەوە ریش دەردەکا؟)) **(پیاز)**

((هەتەکان و مەتەکان، کەوێی شامیی قووتەکان؟)) **(پیاز)**

((دایکی لەوێ خەوتووە، تەرکی لەوێ کەوتووە؟)) **(شوتی، زەبەش، شمزی)**

((خەڕ کەوە، خەڕبەند کەوە، بەستمە پنچك، پنچکیش کەوە؟)) **(شووتی)**

((کەری شین، کەربەندی شین، بەستراوەتەوە لە مێرگی شین؟)) **(بــــــەر و بستە و پنجی رووەکی شووتی، شفتی، شمزی، زەبەش، شامی)**

((کەری شین، کەربەندی شین دام کوتا لە مێرگی شین؟)) **(شووتی)**

((لە ئاسمانان تەبەق تەبەق، لە زەوی کوچك و کەڵەك، ماندوو نەبی عەبا بەڵەك؟)) **(شـووتی،کاڵەك، لـەق لـەق)**

((کراسـی کەسـکە، گۆشـتی سـۆرە، هێسکی ڕەشە؟)) **(شووتی)**

((عەبای کەسك، گۆشتی سۆر، هێسکی ڕەش؟)) **(شووتی)**

((عەبدە ڕەشی ناوخوێنی، عەبا کەسکی مەدینێ ؟)) **(شووتی)**

((شورەی سەوز، عەسکەری ڕەش، رووباری سوور، کلیلی ئەو شارە چەقۆیە؟))

**(توێکڵ وتۆو ناوەرۆکی بەری شووتی و چەقۆ)**

((ولاَتەکی کەسکە، ئاڤا وی سۆرە، خەلکێ وی یێ ڕەشە، کلیلاوی ئاسنە؟))

((دەریای سوور، ماسی رەش؟)) **(شووتی)**

((قەڕاسە پسا، خین ڕژا؟)) **(شووتی کردنەوە و شکاندنی)**

((قەڕیسی ئاو ددەن، گۆلك مەزن دبیت؟))؟؟ **(شووتی، شامی، شمزی)**

((گۆلەوسارم ئاودەدا، گۆلکە شین هەڵدەمسا؟)) **(ئاودانی بڕکە شووتی)**

**((هەتا پەتك ئاویٚ نەخواتەوە، گۆلك ئاویٚ ناخواتەوە؟))(ئاودانی شووتی-کوولەکە-)**

((گورینکی ئاڤدەن، گۆلك قەلەودبیت؟)) **(ئاودانیبڕکە شووتی-کوولەکە- کاڵەك)**

((گلڤلکی ئاڤدەن، گۆلك مەزن دبیت؟)) **(ئاودانیبڕکە شووتیوکوولەکە،...)**

((بابیٚ ڕونشتی ل دیوانیٚ، گونێت وی چوونە کۆلاٚنیٚ ؟)) **(کولندە، کوولەکە)**

((مامێك هەیە لەسەر هەرزاڵێ، گونی داهێشتۆتە ناو ماڵیٚ ؟))

**(کوولەکەی ئاویٚ لەسەر داریٚ)**

((بەدەوری پێغەمبەری، کلك لە تەوقی سەری؟)) **(کدوی ئاویٚ، کوولەکە)**

((چـومە سـەرکانی مـام قەنبـەری، شـتێکی سـەیرم دی لەوبـەری، کلکـی لەسـەر تـەپڵی (تـۆقی) سـەری؟))
**(بستە و بەری کوولەکەی ئاویٚ، کدو، کودی)**

((زگی هەیە، چی ویٚ نییە، کابان دەیگیٚ مێردی نییە؟)) **(کوولەکەی ئاوی)**

((سەرڤە شکێرە، ژبنڤە زێرە؟)) **(سێڤ بن عەردن)**

((هەتا بیخۆن زۆرتر دەبێ؟)) **(توێکلی گوڵەبەڕۆژە)**

((کچا میری ،سەد کراسێت لبەر؟)) **(سەرکە کەلەم- پیواز)**

((لە سەررادیٚ بە ئارۆکە، خۆی پێچاوە بە چارۆکە، نەمریشکە نە باڕۆکە؟))

**(کەلەم- هێلکە)**

((خڕە وەك مازییە، شینە وەك کودییە، سۆرە وەکی شفتیە؟))

**(بەری رووەکی شەفەڵە، کەبەر)**

((خڕە وەك گونی بابت، قەڵشێوە وەك (...) دایکت؟))

(بەری دڕکە کەبەر (شەفەلە)– قۆزاخەی پەمۆ– زەنگوڵ)

((لە خەنجەری تیژترە، لە شەکری شیرنترە، لە سماقی ترشترە، لە مێوژی ڕەشترە، لە بیبەری سۆرترە، زستانان لە هاوینان شینترە؟)) (تووتڕك، دڕی)

((شینە مزرە، سۆرە ترشە، ڕەشە شیرنە؟))

(پەرسیلە(قۆڕە) و بەری ترێیڕەش– تووشامی– تووتڕك)

((شێست پێ لە زەوی، شێست پێ لە دەرەوە، ئەو بەر و پۆیەم بۆ لێك دەرەوە))(دڕی)

((دارەك لەسەر ڕێدا، مۆری و مەرجانی دەبەردا، هەرچی گەیێ دەستی لێدا؟))

(دەوەنی بەلاڵوك)

((کەری عەتارا، خۆسۆرکر ژ بەندکو گوهارا؟)) (هەلهەلوك، بەلالوك)

((دارەك ناڤ دارا، زەر دکێ ژبنیێ گوهارا، بوکا عەلیسێ عەمەرە؟)) (گێوژ)

((دارا لناڤ دارا، زەردکەت گوهارا؟)) (گوهیشك،گۆهێژە،گوێژ، گێوژ)

((خەزێمی زۆرن و شۆڕە، دڕکی وەك چڕنوکی تەیری گۆشت خۆرە؟))

(دڕکە زی، ئەستری، خەزێمە)

((هۆڤە هەستی، وێڤە هەستی، دناڤدا شەکر و بەستی؟)) (باوی، بادام، چەقەلە)

((خڕە وەگ گۆ، ترشە وەك دۆ؟)) (هەنار– لیمۆ)

((تاقە سوار، دام لە دیوار، بوو بە هەزار؟)) (هەنار)

((سوارەك هات بەغار، دای لە دیوار، بوو بە هەزار؟)) (هەنار)

((سەد قووتی، سەمەن قووتی، هەر سەت لەناو یەك قووتی؟)) (هەنار)

((سندوقێکی بێ دەر، پڕە لە دوڕ و گەوهەر؟)) (هەنار)

((هەمبانۆکە، بێ دەرکۆکە، پر داندۆکە؟)) (هەنار)

**((خانوویەکم هەیە بێ دەرگ و بان، پڕیەتی لە خانمی شان بەشان؟))        (هەنار)**

**((لەو لکی چووە سەر ئەولکی، سی و سەدی دەسکی؟))        (هەنار)**

**((سڤۆرەی سك سكی، یێ ل سەر دارێ پندکی( ب پەلکی)، هەزار و ئێکی دزگی؟))**
**(هەنار)**

**((سمێ گای، تژی برنجی قوتای؟))        (هەنار)**

**((چل دەرپ(دەرکە)، چل دەرپیچە، چل خولام، چل خەجیجە؟))        (هەنار)**

**((بەچل برایان عەبایەك))،((سێ سەد کەس، لەبن عەبایەکی؟))        (هەنار)**

**((چل تاق، چل نیو تاق، چل حۆری پاژنە پاك؟))        (هەنار)**

**((بە بەرخی سەوزە، بە کاوڕی سوورە، بە مەڕی ڕەشە؟))**

**(بەری تووتڕك–شاتوو– ترێی ڕەش)**

**((بە مندالی ردێنی سپییە، بە جحێڵی سوورە، کەپیر دەبێ ڕەش دەبی؟))**

**(بەری تووتڕك –شاتوو– ترێی رەش)**

**((بە منداڵیسپییە، بەگەنجی سوورە ، بەپیری ڕەشە؟))**

**(تووتڕك– شاتو– ترێی ڕەش)**

**((باوك پێچ پێچین، دایك لارو وێر، لێی ئەکەوتەوە وەك کەللە شەکر؟))**

**(داری مێو و هۆشییە ترێ)**

**((ڕۆڵەی شیرین و شەوێڵە، دایکی چرچ و چەوێڵە؟))        (مێو و ترێ)**

**((ترشە شیرین دەبی، هەر شیرینەکەیە و  ترش دەبێتەوە؟))(پەرسیلە و ترێ و سرکە)**

**((باب یێ شینە، کوڕی یێ شرینە، نەڤییێ(نەوەی) دینە؟))    (مێو– ترێ– مەی)**

**((دایکا شینە، کچا شرینە، کچا کچێ یا هار و دینە؟))        (مێو– ترێ–مەی)**

**((بەخۆی دەچتە کونێ، کلکی بەجێدەمێنێ؟))        (مێوژ)**

((هەتا کلکی لێنەکەنەوە ناچیتە ژووریٚ (ناچتە کونیٚ)؟)) (مێوژ)

((گای سوور، کلکی نەبڕی ناچێتە ژوور؟)) (مێوژ)

((گاداکر، دیڤ ژێکر؟)) (مێوژ)

((چومە شکەفتەکی، تژی بزنێت بە شاخەکی؟)) (هەگبەی مێوژان)

((رەشی مشمشی، لە کونیٚ دەخشی؟)) (دۆشاوی ناو هیزە)

((بۆ خۆی سەخت و چوێڕە، ڕۆڵەی شەڕ و نیوە شەڕی؟))؟؟ (تریٚ)

((داری بیٚ گولٚ، ئەسحابەی بیٚ دلٚ، خواردنی بیٚ توێکلٚ ؟)) (هەنجیر،هژیر)

((دارێکم هەیە بەبیٚ گولٚ، بەرێکی دینی وەکو دلٚ ؟))

(هەنجیر، گوڵی هەنجیر لە دەرەوە دیار نییە)

((دارێکم هەیە بیٚ گوڵە، میوەی هەتا بڵێی شیرین و بەدڵە؟)) (هـــــەنجیر)

((پۆرگۆکە پڕ ڕشکۆکە))، ((کراوەکی خڕی پڕ مارومێر؟)) (هەنجیر)

((من خوشك هەیە ، سەری تژی رشك؟)) (هەنجیر،هژیر)

((گۆلمچکا تژی ڕشك، بزنەکا کالٚ ؟)) (هەنجیر،هژیر)

((کومی هوتك، تژە نوتك؟))؟؟؟ (هژیر، هەنجیر)

((لە حوشتری بلندترە، لە کونجی وردترە، لە درهەمی گەورەترە، لە شەکری شیرینترە؟)) (دار هەنجیر بەرزە، تۆوەکەی زۆر وردە، قەوارە و تامی بەرەکەی)

((وردە وەك هەرزن، بەرزە وەك حوشتر، شیرینە وەك شەکر؟)) (توو– هەنجیر)

((لە وشتر بڵندترە، لە کەکرەی تاڵترە، لە زۆر شتان خۆشترە؟)) (دارگوێز و گوێز)

((له دار گەزی تاڵ ترە، لە حوشتری بڵندترە، لە هێلکە[2]ی گچکە ترە؟)) **(گوێز)**

((ئودامشتی، دوو فەقە[3](فێقی) تێدا ڕونشتی؟)) **(گوز، گوێز)**

((خڕە و ڕەقە وەك كەلایە، چوار منداڵی لە زكی دایە؟)) **(گوز، گوێز)**

((چوار برانە بە کلاوەکی))، ((دوو برانە ناڤ هەردوو برا پەردەکە؟)) **(گوز، گوێز)**

((نێوەکەی چوارە، دەورەکەی دارە؟)) **(گوز، گوێز)**

((بەر چووکەی قالب مەزن، ئەگەر نەزانی ببیە بزن؟)) **(گوز، گوێز)**

((تشتەکێ من ژ تشتانە، شیری ددەت ئێ بێ گوهانە؟)) **(گوێزی هندی- کانیاو)**

((لە پەرێزێ کەسکە، لە بازارێ ڕەشە، لە ماڵێ سۆرە؟)) **(چا- ڕەژوو،خەڵوون)**

((لە دار سەوزە، لەبازاڕ ڕەشە، لە ماڵان سوورە؟)) **(تۆچا- ڕەژوو)**

((لە باخ دا سەوزە، لەبازاڕ ڕەشە، لە ماڵەوە سوورە؟)) **(تۆچا- ڕەژوو)**

((ڕەشە و گەرمە و تەڕ ە و تاڵە؟)) **(چایە)**

((هەموو بەهاران جحێڵە، پایزە نویرە؟)) **(داری گەڵاوەریو)**

((سەوزە لە بازاڕ، سورە بەدایکت؟)) **(خەنە)**

**((دایك لێڕە، كچ بازێڕە؟)) (مازوو- ڕەژوو، دار مازوو لە چیایە و مازووەکەی لە بازاڕە)**

**((هەلاران و مەلاران، هێلکەی ئەکا لە داران، بۆ فەقیر و هەژاران؟)) (مازوو)**

((داری حەفت بەر، خۆشەی کووندەی، تیماری زمانی؟))

---

2- هێلکەی مریشك.

3- فێقیێ= میوە.

**(دارمازی، جەوت بۆ خۆشکردنی پێستە و کووندە ، مازوو و شەب بۆ زارکولی بەکاردێن، مازوو تەنها بەرێك دەگرێت ئەویش بـــــەڕوو و جەوتە، پێنجەکەی دیکەی (گروان، سیچکە، ماغی، ریشە، گەزۆ) لە ئەنجامی توشبوونی چڵ و گەڵای دارەکە بە چەند جۆرە مێروێکەوە دەردەکەون.بەڵام بە هەڵە بە بەری دارەکە ناویان ناون.**

((هەژ ڤێرە، هەتا سندوور، هەمی لاوێت رتل سوور؟))

**(گروانی دارمازی– بەری خڕنوك)**

((ژ ڤێرە، هەتا میسکا، هەمی رتلێن گیسکا؟)) **(بەڕوو)**

((کراسی یەك تەقە، کڵاوی سەر ڕەقە، بۆ خواردن هەقە؟)) (بەڕوو)

((وەختەکی شینە وەك قەزوانی، وەختەکی زەردە وەك سیقەدانی؟)) **(دمووکانە)**

((ڕایەڵێ لە سپیلکی، تیوەرێخی لە سۆرکی، برینەوەی لە شینکی؟))

**(فەریکە قەزوان لە سەرەتادا سپیپاتە و دواتر سوور دادەگەڕێت، کە پێدەگات ڕەنگی سەوزێکی شینباوە، ئینجا دەیڕنن)**

((سپی رادچنیت، سووری تێ دەوەڕێت، بە شینی دبڕن؟)) **(کەسکوان، قەزوان)**

((تشتێ من تشتە، یێ بێ بەر و پشتە، پاڤێژیە هەموو دەران ناشکیت، پاڤێژیە شکەفتەکێ دێ شکێت؟))

**(قەزوان و دەم)**

((لە شاخێك هەڵی دەیە خوارەوە ناشکێ، بیخەیتە ناو چاڵێکەوە دەشکێ ؟))

**(قەزوان و دەم)**

((باڤێ پشت حەفت چیایا چ لێ ناهێت، باڤێ دکونەکێدا دیشکێت؟)) **(کەزوان)**

((سندوقێ سەمەنێ، تەقە مەکە ئەیشکێنێ ؟)) **(قەزوان)**

**((سەر دەتوو، بن دەشاخی؟)) (قەزوان دەخۆی و دارەکەشی لە دارستانی چیاکانە)**

((سەری زەردە، ناوی بەردە؟)) **(بەری زەردەلوو، قەیسی– خورما– خورمالۆك)**

کوردستان خاکێکی بە پیت و ئاوێکی سازگار و ئاووهەوایەکی لەباری هەیە، بۆیە لە کۆنەوە جەنگەڵی چڕ و زەمەند وپووش و پاوان و دانەوێڵەی زۆری هەبووە، کە ئەمانەش ژینگەیەکی گونجاو(خۆراك و جێگە و ئاووهەوای لە بار) بۆ بڵاوبوونەوە و زۆربوونی گیانداری دیکەی دێنێتە کایەوە. ئەو مرۆڤە لە ژینگەکەیدا چاوی هەڵێناوە و لە دەوروبەری خۆیدا جۆرەها گیانداری کیوی دیوە و راوی کردوون ، هەنگ و کوللە و ... باڵندە رەنگاورەنگەکان، گیانلەبەرە جۆراوجۆرەکان، سوودبەخش و زیانبەخشەکان سەرنجیان راکێشاوە...

رەوەندی و ئاژەڵداری پیشەی باپیرانمان بووە، مەڕ و بزن و مانگا و ماین و کەر و مریشك ... یان بەخێوکردووە و بە بەروبوومەکەیان پێداویستە سادەکانی ژیانی ئەوسا و ئێستایان دابین کردووە، بۆیە ناکرێت لە خەیال و بیرکردنەوە و بەرهەمە ئەدەبییەکانیدا ئەم گیاندارانەی دەوروبەری فەرامۆش کردبێ، دەقی ئەم مەتەڵانەی خوارەوەش راستی بۆچوونەکەمان دەنوێنن:

((گۆشتی بێ هێسك؟)) (کرم- مەمك-کوارگ)

((سپییە وەکی مشك، بەهاران تەڕە، پایزان هیشك؟)) (شەیتانۆکە، قەپووچکە، قاوغ)

((سپییە نەکەشکە، گوێی هەیە نەمشکە، بەهاران تەڕە، هاوینا هیشکە؟))

(لوولپێچ، هێلکە شەیتانۆکە،شەیتانۆکە، رۆندز ، قەپووچکە، قاوغ)

((سپییە وەك کەشکی، تەڕە وەك مەشکی، گەر نەزانی تۆقی سەرت بشکێ؟))(رۆندز

((ئەوە چییە سپییە وەك کەشکی، قوتە وەك مشکی؟)) (هێلکە شەیتانۆکە)

((یێ کەژە وەکی کەشك، یێ میتە وەك مشك، بەهاران تەڕە، پایزان هیشك؟))

(لوول پێچ، قاوغ، هێلکە شەیتانۆکە)

((نەکەشکە، نە مشکە، گەر نەزانی بگری گەشکە؟)) (قاوغ، هێلکە شەیتانۆکە)

((سحر هێسك، بەدەن ناسك، چار چویچکی بیٚ پێچك؟))　　　(شەیتانۆکە)

((سەری هێسك، بەدەن ناسك، چوار گوێی بیٚپێچك؟))　　　(شەیتانۆکە)

((بەری گەڵایە، وەك هەڵوایە، شیرین دایە، شیرین دایە؟))　　　(گەزۆ، شۆکە)

((مەڕە ڕەشی موکری، نەمووی هەیە نەخوری؟))　　　(کێچ)

((تشتی من تشتۆکە، یی بیٚ کولاڤ و دەسرۆکە، ناڤیٚ ویٚ زڕچەپۆکە؟))　　　(کـــێچ)

((هیرە وەك هەرزن، ڕەشە وەك بزن، مەلاو حاکم لبەر دلەرزن؟))　　　(کێچ)

((پیٚ پلنگی، ددان سنگیٚ، بەعیساکەی بە مووساکەی، ئەگەر چیدیم لە خەو ڕاکەی؟))

(کێچ)

((هەڵدەپەڕی قەڵانی، حێلم قوتیٚ دەزانی؟))　　　(کێچ)

((ڕەشە وەك بزن، ووردە وەك هەرزن، بەپێنج بۆی ئەڕۆن، بە دووان ئەیدزن))

(کێچ بە دەست گرتن)

((ئەم لام تات و ئەولام تات، وەی بابە جیقم دەرهات؟))　　　(ئەسپیٚ کوشتن)

((سەر تاتە لووس بن تاتە لووس،.................؟))؟؟؟　　　(ئەسپیٚ- کیسەڵ)

((قوڵینگ لووتییەتی، شەش پەلی هەیە و چوار پەڕ باڵیەتی، عالەم لە چنگی ناڵە ناڵیەتی؟))

(پێشکە،پێشوولە، مێشوولە)

((سەری هەسپە، قوونی(بنی) قەسپە، پێی دارە، ددانی مشارە؟))　　　(کوللە)

((بەباڵ مەل و بەشاخ گایە، ماسی پشتە، هەڕە پایە؟))　　　(کوللە)

((مەلێکمان هەیە مەلە خاتۆرە، قاچ و قول باریك، سەر باڵی بۆرە؟))　　　(کوللە)

((بەنێشەوە بەمێشەوە، بە خالقی دەروێشەوە، پەنجەی تەواو لەپاشەوە، پانیەی ئەوا لە پێشەوە؟))
**(دەستی کوللە، کولی، کلۆ)**

((بەخێشەوە بەمێشەوە، بەخالقی دەروێشەوە،چیت دی پانی لە پێشەوە؟))
**(دەستی کوللە)**

((مامێکم هەیە لە دەشتێ، قەرتاڵەی گووی لە پشتێ؟)) **(کیز،گووخڵە،قالۆنچە)**

((داپیرەکم هەیە لە دەشتێ سەوییە ریخەکی لە پشتێ؟)) **(گووخڵە،قالۆنچە)**

((گایەکم هەیە گاباری، نە گۆشتی دەخورێ نەباری؟)) **(گووخڵە،قالۆنچە)**

((گای ڕەشی مرواری، بەخۆی دەخۆی یا باری؟)) **(گووخڵە،قالۆنچە)**

((لەسەگ بەبۆن ترە، لە توولە ڕەش ترە؟)) **(کیز، گووخڵە، قالۆنچە)**

((ڕەشە مێوژ نییە، دەفڕی تەیر نییە، ئەنگوتك دەكا ژن نییە؟)) **(قالۆنچە)**

((ڕەشە بزن نییە، کفتەی دەکا ژن نییە؟)) **(کیز، قالۆنچە)**

((ئەگەر بەبارە بەچوار پەلانە، ئەگەر بێ بارە، بە شەشانە؟)) **(کیز،قالۆنچە)**

((باڵی هەیە سەرکەوی، وەدوو کەرێ ئەکەوی؟)) **(گووخلە، قالۆنچە)**

((لە دوور مەیۆ، لە دوور مەیۆ، گرمەی بەراتە سورمەیۆ؟)) ( زەردەواڵە)

((هەر لێرە هەتا شارەزوور، هەموو قەشەی(سەیدی) سمێڵ سوور؟)) **(زەردەواڵە)**

((لێرە هەتا شارەزوور، بەباڵ دەفڕێ سمێڵ زەردی پێستە سوور؟)) **(زەردەواڵە)**

((هەر لێرە هەتا مزور، هەمووی چەتەی کلاّو(ردێن) سوور؟))
**(زەردەواڵە، زەنگە سوورە، ستانگ)**

((چوومە کۆریتەکی هەناو رەشە، پڕی ئەسپی سۆربەشە؟)) **(زەردەواڵە)**

((خاڵۆیەکم هەیە یارۆ یارۆ، دەرقنگ ڕەشی ناوچەوان مارۆ؟)) **(زەردەواڵە)**

((تانجییە زەردی زرزرە لە گوێ، سەیران ئەکا لە دەوری دێ ؟))؟؟؟

**(زەرگەتە، زەردەزیرە)**

((ڕەش ڕەشە کار نییە، جۆ خۆرە کەر نییە، دیوار برە دز نییە؟)) **(مێروولە)**

((خانوویەکم هەیە تەنگ و تاریک، پڕە لە حوشتری مل باریک؟)) **(شارە مێروولە)**

((بانیو (ماڵێکما) هەن تاریک تاریک، پڕا قووڵی مل باریک؟)) ؟؟ **(شارە مێروولە)**

((گاڕانەک دچتێ تلیا من ناچتێ؟)) **(شارە مێروولە)**

((هۆڵەکم هەیە سەد سەر مەڕی دەبا، بەڵام چڵە گیایەکی نابا؟)) **(شارە مێروولە)**

((ئەشکەوتی سەد پاڵەوانان، بە قامکە پۆشێ دەگیرێ؟)) **(شارە مێروولە)**

((چوومە سەر گردەکی، هرەم کردە مەڕەکی، هەموو دێن لە ڕەنگەکی؟))

**(شارە مێروولە، بانگەواز)**

((نەکەرە نەهێسترە، بار ژ قالبی مەسترە؟)) **(مێروولە، مێرووستان)**

((برایەکم هەیە لە زوورگی، سەری گەورەترە لە هوورگی؟)) **(مێروستان)**

((سەرێ عالمانە، نافتەنگا زاهیدانە، کوونێت بالگیرانە؟))

**(سەر و ناوقەد و قنگی مێروولە)**

((قافلـــەی ســـەر زەمـــین، کاســـبکار بـــێ زمـــان، هەرچـــی هەڵیـــدا ســـەد ئافـــەرین نەوجـــەوان؟))

(مێرووستان ، مێروولە)

((مێگەلە بزنێ (مەڕە ڕەشەی) لە جێجۆخینێ، نەگۆشتی دەحورێ ، نەدەدۆشرێ؟)

(مێروولە)

((مەڕی حەمەدی ئامینێ، بەریان دا ناو گڵە شینێ، نە دەدۆشرێ، نەدەفرۆشرێ؟))

(مێروولە)

((مەڕی دایە، لە پشت مایە، نەدەیدۆشن، نەدەیفرۆشن؟)) (مێروولە)

((حەوایلکەی حەوا دەکا، لە ژنان کولێرەی چاتر دەکا، دیاری حاکمان پەیدا دەکا؟))
(هەنگ و شانەی هەنگوینی)

((سەما کەرێك بەچوار پەلان سەما دەکا، خواردنی پادشای پەیدا دەکا؟)) (هەنگ)

((ژن نییە کولێرە کەرە، مار نییە سەر بەکونە، هەوریش نییە دەگرمێنیٚ؟)) (هەنگ)

((مەتەڵ مەتەڵ نەتۆزی، مانگای کاکە گەڵۆزی، نەگەڵی هەیە نەگوان، شیری دەدا بە هەمووان؟))
(هەنگ، کانیاو، گوێزی هیندی)

((نە گەڵی هەیە نەگوان، شیر دەدات بە هەمزەی شوان؟)) (هەنگ، کانیاو)

((دارێکم هەیە لە نێو داران، دەیبڕنەوە بە مشاران، ناڵەی دێ وەك برینداران))
(بڕینەوەی هەنگ لە کلۆرە داردا)

((ئەز چومە دەشتا گەڤەرە، من تەیرەك دیت ب شاش و ب پەڕە، دارا حشکە، فێقیێ تەڕە؟))
(شانا هنگڤینی)

((تەیرەك هات، نانەك هات، نە فترەیە، نە زەکات؟)) (هەنگ و هەنگوین)

((خۆشە، گوشە؟)) (هەنگوین، راست نییە؟چونکە هەنگوین گووی هەنگ نیە)

((هەمیشێو مەمیشێ، هەر لە گووی خۆی دەنیشێ ؟)) (هەنگ، راست نییە؟؟)

((گەلەم رانی، پەچەم دۆشی؟))
(هەنگ بڕینەوە. مێشهەنگ دەکرێنە دەرەوە ئینجا هەنگوینەکەی دەردێنن)

((مەڕم رادا، هەوێزم دۆشی؟)) (مێــشهەنگوین بڕینـــەوە)

((دەخۆی حەلوای سەرینجی، یان گووی مێرووە قنجی (قەڵاسنجێ)؟))
(گوو سەگ، هەنگوین، قەڵاسنج گوندێکی بناری سەفینە بە هەنگداری بەناوبانگە)

((داپیرەکی رەق و هیشکە، تەونی دەکا بەبێ پیشکە؟)) (جاڵجاڵۆکە، داپیرۆچکە)

((دەخوا بێ قوونە، دەڕوا بێ شوونە؟)) **(گەنە، قڕنە)**

((گیان لەبەرە مووی نییە، خواردنی هەیە، ڕیتینی نییە؟)) **(گەنە، قڕنە)**

**((دەمی هەیە قنگی نییە، خواردنی هەیە، ڕیتینی نییە، پێستی هەیە خوری نییە؟)) (گەنە، قڕنە)**

((هۆە، هۆە، هۆی نییە، چەرمۆکەیە مووی نییە، خواردنی هەیە گووی نییە؟))
**(گەنە، قڕنە)**

((مەیلەکم هەیە لە دەشتێ، کەچە شیرەکی لە پشتێ؟)) **(دووپشك)**

((زەردی لەبن بەردی، ئاڵقەی شێری، زوادی مەردی؟)) **(دووپشك)**

((چەقماقە، چەق و لەقە، یێ دەستێ خۆ بکەتێ ئەحمەقە؟)) **(دووپشك)**

**((لاوکێ ئەلمانا، دگەریێت ل کۆلاْنا(سەربانا)، قوین تیژترە ژ ددانا؟)) (دووپشك)**

((ئەز چومە سەربانەکی، قوین کەفتە سەر ڕانەکی، حەفت دوونگ ب بەرانەکی))
**(دووپشك)**

((حەڵقە زەردە، لەبن بەردە؟)) **(دووسەرە،دووقەدەرە– هەزارپێ– دوپشك)**

((گیانەوەرێکە سەیری وانییە، بە دوو سەر ئەڕوا و هیچ خوێنی نییە؟))
**(گرژاڵ، قڕژانگ، قڕژاڵ)**

((هەشت لاقە و دوو سەرە، بە پێنج پیت ناوی بەرە؟)) **(قڕژاڵ)**

((هەشت پێ و دوو سەری هەیە، تەڕالکە و خوێنی نییە؟))؟؟؟
**(کیڤژاڵ، گرژاڵ، قڕژانگ، قڕژاڵ)**

((هەشت پێی هەیە، بەرگە و باخچەی وشکی و تەڕییە؟))؟؟؟ **(قڕژانگ، قڕژاڵ)**

((کوشتمەوە خوێنی نییە، کەورم(کەوڵم) کرد پیستی نییە؟)) **(قڕژانگ، قڕژاڵ)**

((هێستره شەشەم، هەشت پاو دوو دەم،ماڵیان لە چەم، بێ ترس و خەم؟))

(قرژانگ، قرژاڵ)

((سەر تەنتەنە، بن تەنتەنە، چار چنگی فیلی ڤەنگە لووس؟)) (قرژاڵ, کیڤژاڵ)

((باڵی هەیە نافڕێ، دەمی هەیە ناقڕێ، چاوی هەیە ناترووکێ، گۆشتی هەیە دەخوری ؟))

(ماسی)

((دەمی هەیە ناقڕی، بێ پێ و بێ باڵە ئەفڕێ، گۆشتی ئەخورێ، سەرنابڕی؟)) (ماسی

((لە ژوورێ دەژی، لە دەرێ دەمری؟)) (ماسی لە ناو ئاودا دەژی)

((چوار باڵ و دوو چاوە، دوژمنی زەوی و هەتاوە؟)) (ماسی)؟؟

((باڵی هەیە نافڕێ، زاری هەیە ناقڕێ( ناچڕێ)، قوونی هەیە ناتڕێ، دراوی هەیە ناکڕێ ؟))

(ماسی)

((مەلاو قەشەو ماڵە، گۆشتێك دەخۆن بۆ هەموویان حەلاڵە؟)) (ماسی)

((زمانی نییە و گۆشتی دەخورێ ؟)) (ماسی)

((بێ پەڕ و باڵە( بێ مل و باڵە)، ئەگەر مرد گۆشتی حەلاڵە؟)) (ماسی)

((شەش باڵ و سەرێ دایم لە گەوە، گەنج و جەواهیر مەکانی ئەوە؟)) (ماسی)

((چوار باڵ و سەرێ، دایم بەدەوە، دوڕ و جەواهێر مەکانی ئەوە، زەردەی خۆرئاوا لێ بەئەنێشە، هێستری مزگێنی بزانی چێشە؟)) (ماسی)

((زەردی خۆراوا لێی بەئەندێشە، حەکاك ئەو کەسە ئەزانێ چیشە؟)) (ماسی)

((کلاّفەی کەوە، مرغی بێ زمان، هەرکەسێ هەڵیبێنێ ئافەرین جەوان؟)) (ماسی)

((قەلاّی گۆشتن، میراوی ئاوە، هەرچی هەڵیدا، ئاقڵی تەواوە؟)) (ماسی)

((عەکسی مانگ و ڕۆژ لێی بەعەیانە، ئەگەر بیزانی منای عەیانە؟)) **(ماسی)**

((زەردی زەردی، لەبن بەردی، حوکمی ڕۆژێ، زراوی بردی؟)) **(مار، دووپشك)**

((زەردی زەردی، لەبن بەردی، ئەڵقەی شێر و گوی نامەردی؟)) **(مار، دووپشك)**

**((کلاڤەی چین چین، چین لەسەر چینانە، هەرچی هەڵیبێنێ ڕۆستەم پاڵەوانە؟)) (مار)**

((تێلاَی تاشراو وەستا نەدیو، کەوای دوراو خەیات نەدیو؟)) **(مار و کاژەکەی)**

((توولی تەڕ، دەوبەندی(توولبەندی) تەڕ، دەستی مەکێ، شەیتانی شەڕ))**(مار)**

((ئاسنی سار، لە کونە دیوار، گیت لە گیت، گیت خەپی تار؟)) **(مار)**

((شوا تەڕ لەسەر گەوهەر؟)) **(مار)**

((بێ دەست و پێ، ب رێڤە دچیت؟)) **(مار)**

((شتەکی من چشت نەکەیە، بەعەبای جوڕنەکەیە؟))

**(قومقومۆك،خەمە گڕوو- مارمیلۆق)**

((شڵی قوولی(گوولی)، بێ موو، ئەقیڕێنی زوو زوو؟)) **(بۆق)**

((قوندەی بێ موو، دەقیڕێنی زوو زوو؟)) **(بۆق)**

((شلی قوولی بێ مووە، قرە قری لە دووە؟)) **(بۆق)**

((شل و نەرمە و بێ مووە، لە نێو ئاودا زیندووە؟)) **(بۆق)**

((چار(چوار) پێی قووتەکە( قووندەکە)، لەبانان ڕادەکا؟)) **(بۆق)**

((بەباری کلکی هەیە و پێی نییە، بەخرتی پێی هەیە و کلکی نییە؟)) **(بۆق)**

**((بە منداڵی کلکی هەیە و لاقی نییە، بە پیری لاقی هەیە و کلکی نییە؟))**

**(مێکوتە و بۆقی تەواو)**

((قوڕە شینی بێ موو، ئەقیڕێنێ زوو زوو؟)) **(بۆق)**

((مەڕە کەڕەی بن گەوڕەی، هەڵدەپەڕێ و نالەوەڕێ ؟)) **(بۆق)**

((ئەوە چییە بە دەست شێرە، بە پێست پڵنگە، بە چاو بازە؟)) **(بۆق)**

((بانی قانی کۆتکانە، جرت و فرتی جاشکانە؟)) **(کیسەڵ، جلە، رەقیاو)**

((لەسەری عروسە، لەلنگا ئینگلیسە، لە نێوەندی پیسە؟)) **(کیسەڵ)**

((سەرتاتە لووس، بن تاتە لووس، چارچنگەڕۆ، فیر مەنگەنووس؟)) **(کیسەڵ)**

((سەر ئاڤە لووس، بن ئاڤە لووس، سەرخەنکی فێڵی فەنگەنووس؟)) **(کیسەڵ)**

((سەرتانە لووس، بن تانە لووس، قوڕی کەنیٚ قوڕ مەنگەنۆس؟)) **(کیسەڵ)**

((سەرش هەسان، چیریش هەسان، دلیراسیش بەچکە شەیتان؟)) **(کیسەڵ)**

((پشتی بەردە و بەرد نییە، چوار پێی هەیە کەر نییە، کەما خۆرە و کەر نییە؟))

**(کویسەڵ، کیسەڵ، جلە، رەقیاو)**

((سەری بەردە بەرد نییە، ژێری بەردە و بەرد نییە، گیا خۆرە کەر نییە، هێلکەکەرە مرنییە؟))

**(کویسەڵ، کیسەڵ، جلە، رەقیاو)**

**((دەپە نەدارە، ستوو قاقیچکە، هێکا دەکەت نە مریشکە؟))** **(کیسەڵ، جلە، رەقیاو)**

**((مریشکە قوڵی گاڕگاڕدەکا،دانی ناخوا و هێلکەش دەکا؟))** **(کیسەڵ)**

((سەرڤە دەپە و دەپ نییە، ژبنڤە دەپە و دەپ نییە ، هێکا دکەت مریشك نییە))

((دچەریت کار نىییە، دزەلیت مار نییە، هێکان دکەت مریشك نییە؟))**(کویسەڵ)**

((پیری بن گلی، دەلێی بەردە بن هەنگلی؟)) **(کیسەڵ، جلە، ڕەقیاو)**

((ئەم لای شاخ و ئەولای شاخ، تێیدایە چورچەی پەیداخ؟)) **(کیسەڵ)**

((پەزی هەکەو مەکە، دزێت گرێژنەکە؟)) **(کیسەڵ، مریشك، کەو)**

**((لێرە چووم هەتا مەکە، هەمی میهێت کوڕەکە، دزێن و گرێژ نەکە؟))**

**(کیسەڵ، مریشك، کەو)**

**((سەرڤە دەپە نەدارە، بنڤە دەپە نەدارە، گیای دخۆت نەکارە، دچیت کونێڤە نەمارە))**

((هێڕ هێڕیە نەکارە، چلی خۆرە نەمارە، سەر دەپەیە نەدارە؟)) **(کیسەڵ)**

((مەیلەکم هەیە لە دەشتێ، کەچە سێلەکی(تاتە بەردەکی) لە پشتێ ؟))**(کیسەڵ)**

((چەرم و چیقالە، مووی نینە، چار دەست و پێنە، دویف لێنە؟))؟؟ **(کیسەڵ)**

((شووتی شەترقی، دام لە بەردی نەتەقی؟)) **(کیسەڵ)**

((کوڕێکمان بوو بێ دەست و پا، ژنێ بکە شوکری خودا؟)) **(هێلکە)**

((نەمریشکە نە باڕۆکە، بە سەری خۆی دادا سپی چارۆگە؟)) **(هێلکە)**

((خرشە وەك گۆ، سپییە وەك دۆ؟)) **(هێلکە)**

((کاشی چینی، ئاوی دوو ڕەنگ؟)) **(هێلکە)**

((قۆریە و فەخفوری، ئاوی دوو ڕەنگ؟)) **(هێلکە)**

**((پیاڵەی سپی ئاوی دووڕەنگ؟))** **(هێلکە)**

**((جامی(بادیێ) تەنگ، ئاوی دوو ڕەنگ؟))** **(هێلکە)**

((سێنی و فەخفووری، ئاوی دوو رەنگە، بەساردی شلە، بەگەری تونگە؟))

((گوێزێکمان هەیە سپی ڕەنگ، تێیدایە ئاوی دوو ڕەنگ؟)) **(هێلکە)**

((دەریای دوو ڕەنگ، بێ شەپۆل و دەنگ؟)) **(هێلکە)**

((لە دەرێ یەکە و لە ژوورێ دووانە؟)) **(هێك، هێلکە)**

((عەمەرە، عەمەرە، سێ پێستی سپییە و ئێکی زەرە؟)) **(هێك، هێلکە)**

((سایقەی سامالێ هەوری فەڕەنگی، دوو ئاو لە جامێ، هەریەك لە ڕەنگی؟))

**((هاتە مالامە عەنتەر ، دوو کورتەکیت لبەر، ئێك سپیەیە،ئێك زەر؟)) (هێلکە)**

((مامێ من حەیدەرە، سێ قوتك لبەرە، دوو سپیەنە، ئێك زەرە؟)) **(هێلکە)**

**((یەك فەردە خوێ دێنێ، دەیخەینە ناو خوێێ هەر سوێر نابێ ؟)) (هێلکە)**

((کلاوی هەمزە پاڵەوان، نە دەرزی دیوە نە درووومان؟)) **(هێلکە– جەفت)**

**((کلاوی هەمزە پاڵەوان، بێ تێکەڵ(تەقەڵ) و بێ دورمان؟)) (هێلکە–کلاوی بەڕوو)**

**((کراوی هەمزە پاڵەوانی، نە درزی هەیە نە درووومانی؟)) (هێلکە –کلاوی بەڕوو)**

**((کلاوی هەمزە پاڵەوان، بێ دوورمان و بێ نیشان؟)) (هێلکە –کلاوی بەڕوو)**

((هێسکەی کادینە، چ پێبلکەی نینە، مردی تێدا ژینە؟)) **(هێلکە)**

((قەسری سپی بێ دەرگا، زیندەوەرێکی وا تێدا؟)) **(هێلکە)**

**((خانووی سپی بێ دەرگا، زیندەوەرێکی لە ناودا؟)) (هێلکە)**

((ماڵی ئەحمەد پاشایە، بێ پەنجەرە و دەرگایە؟)) **(هێلکە)**

**((قەلایەکم هەیە گەچ گەچین، نەپای هەیە نەپاچین؟)) (هێلکە)**

**((قەلاّی گەچین، ڕێی نییە تێی بچین؟))　　　　(هێلکە)**

**((قەراتۆکەی گێچینە، هیچ پێبلقەی لێ نینە، مردی تێدا زندینە؟))　　　　(هێلکە)**

**((خانییێ بێ دەری))،((گومەتێ سپی بێ دەرك؟))،　　　　(هێلکە)**

**((قەسری سپی بێ دەرگەهـ؟))　　　　(هێلکە)**

**((مەتەلۆك و مەتەلۆك، قوینا تە دکەم مەنجەلۆك، ئاڤکێن بانا، شلقا ل خۆ ددەت، یێ دبەمە دهۆك؟))**

**(هێلکە)**

((میرێ(لاوێ) زەرێ یێ دقەسرا سپیدا؟))　　**(زەردێنەی هێلکە، زەرکا هێکێ)**

**((زەرێ زەرانێ، ل ناڤ مێزەرا کتانی، نە ل عەردییە و نە ل عاسمانی؟))(زەرکا هێکێ)**

**((عەجایب گومەتێکم دیت، مانگ و ڕۆژی لەنێو دایە، کە ڕۆژ هەڵدێ لە گومەتدا، بلەور شوشە دەشکێنێ، ئەگەر نایزانێ ئاسانە، تیرۆکەش هەڵیدێنێ؟))**

**(هێلکە)**

**((بلوورین گومەزێکم دی، مەوهو ڕۆژی لەنێوابوو،**
**کە ڕۆژ هەڵێ لە گومەزدا، بلوورین شووشە ئەشکێنێ،**
**ئەگەر مەردی و مەتەڵ زانی، بەفیکری خۆت هەڵی بێنە،**
**موعەممایەکی هێند سەهلە، کە تیرێکیش هەڵیدێنێ؟))　　(هێلکە)**

((زیندوو لە مردوو پەیدا دەبێ، مردووش لە زیندووی پەیدا دەبێ؟)) **(هێلکە)**

((نەنە کوڵکن، تەتە نەکوڵکن، تەتەزا کوڵکن؟)) ؟؟؟　**(مریشك، هێلکە ، جووجەڵە)**

**((دەوێتە کولکن، دەوێتەزا نە کوڵکن، بەچەی بەچەزا کوڵکن؟))؟؟　　(مامر و هێلکە)**

**((بەموو لە بێ مووی پەیدا دەبێ، بێ مووش لە بەمووی پەیدا دەبێ؟))　　(هێلکە)**

((ریتۆ ژ پیرتۆ دبێت، پیرتۆ ژ ریتۆ دبێت؟))　　　　**(هێلکە)**

